______________--ss

# قەصیدەی

## بێ هەسترین مەخلوق




لە نوسینی

ئیدە پاتۆ

------------------------------------------------------------------------------------------------------------------ -
------------------------------------------------------------------------------------

سلاو.

... ( بە پێشەکیەکی زۆر کورت (ژیانی دووبارەیە. لە دنیادا هیچ چێژێک نییە بەراورد بکرێ بە چێژی خوێندنەوە

سەیری ژیان مەکە بۆ ئەوەی کەمێک داهاتوو ببینی

ژیان هەموی دوبارەیە

..... سەیرێکی کتێبەکان بکە با ژیانێکی تازەت بۆ دروست کەن

---

( قەصیدەی ( بێ هەسیترن مەخلوق

---

منداڵ بوم هاورێی مەلو باڵندەکان بوم

بەدەنگی ئەو کوکوختەی هەیوانەکە کە دەی خویند

مەست دەبوم ژیر دەبوم

من رقم لەپشیلەکان بوو کە هەمیشە دایکم لە بێعاریەکانما بۆی بانگ دەکرم ئەرێ دایکم دەیوت

پشەکە وەرە بیخۆ دەهات وەلێ نەی دەخواردم ئەوە تەوا تەنها گاڵتەو گەپێک بوو بۆ ترسانی من ئەرێ

من سادە ژیام ژیان سادە بوو

چاوەکانم داخست کاتێ هەڵم هێنایەوە

تەماشام کرد کوکختی ببوە ژمە خواردنێکی خۆم

کە دایکم لە تاو نەبونی و برسێتی سەری بڕیوو بۆی

ئامادە کردم

بەڵێ

... پشەکەش تەمەنی هێندە زۆر ببو ئیدی تاقەتی گاڵتەو گەپەکەی جارانی نەمابوو

ئەرێ

ڕوانیمە ئاسمان باڵندەکان وە گوڵ وە زەوی

نا هیچی لە جێی خۆی نەبوو ئاسمان سور هەڵگەرابوو باڵنەدەکان تاقەتی فرینیان نەمابوو

گوڵەکەن شەکەت ببون دەستی پایزیان گرتبوو

. ئەرێ زەویش خەریکی ئێخە دڕین بوو

من نامۆ بوم بەم گڵو خاکە

ئێستا مرۆڤەکان هاوار دەکەن من ئازادیم ئەوێو

خۆی پر چەک کردوە بۆ ئازادی ..! لێرە جەنگە گشتی بۆ تۆڵە دەژی

من نامۆ بوم بەم ژیانە نامۆ بوم بەم هەموو ئێخە

درانە

من دەم ویست لەگەڵ مەلەکان بفرم

چێژ لە جوانی گوڵ وەر گرم ئەرێ منیش حەزم

لەفرین بوو کە نەکرا  باوکم هاتوو چەکێکی بۆ هێنابوم

بە دەستە قلیشاو قاچە لەر زۆکەکانیەوە وتی

کورم ئیدی من شتێک نەما لە پێناویدا بجەنگێم

!....  دایکت ڕۆی

منیش هێشتا لەو مانایە نەگەشتبوم

بەس چاوەکانم پڕ بوون وتم باوکە بۆستە

ئەرێ تۆ بۆ کوێ ئەچیت ئاورێکی دایەوەو

وتی

!.....  کورم با تەنها نەبێ دایکت

بەڵێ

ئەویش رۆشت

لەکوچەی ئەم شارە بێ رەحمەدا

منو خۆمو تەنهایم دانیشتبوین لە پڕ

خانمێ

گوزەری کرد

(دەنگی پاژنەی پێ?وەکەیم بیست (تاق تاق تاق

لەکۆلەنە ساردوو بێ دەنگەکانی شاردا پیاسەی

دەکرد

ئەو خانمە بێ پرس دڵی بردم ئێستا من باش نیم

لەنێوان ئەم هەمو سەر خۆشەدا پێویستیم بە مەست

!..  بونێک بوو

لەنێو هەم هەمو رۆژە تاریکەدا پێویستم بەرووناکی

!..  هەیە

بەڵێ پێویستم بەرونکای بو

سەیر کە دوای تۆ چلۆن یاریم پێ دەکەن

زەمان کردونی بە گاڵتە جارو دزی لە تەمەنم

دەکات بەچاوی خۆم یەک یەک مردنو سپی بونی

.  تا?کەنی سەرم دەبینم

من خیانەت لە خۆموو تۆش لە هەستم ژیانیش لە تەمەنم

ئەری ئەرێھـــــــ

بێ باکەنە دەژیم

ئەری ئەرێھـــــــ

بێ باکەنە دەژیم ژیان پێم دەڵێ زیادی

زیادی لەمنو لە خۆڵو لە مەلو لە خۆشەویستی

من ئاشقی ئەو پەپپولەیەم کە منداڵی شارمکەم

.. باڵەکانیان هەڵ کەندو بێ باکانە بە چاوەروانی مەرگەوە دانیشتوە کە نایەت

بەر پرسیارم لەشکانی ئەو د?نەی بۆ من دەژیان

بەر پرسیارم لە مەرگی پەپولە

لەکۆچی باڵندەکان ، لەو قارچکەی بوە چەتری

دوو میلورە بۆ ئەوەی تەر نەبن لە بارانی زستان

کەمرۆڤی چاو برسی ئەویشی هەڵ کەندوو مێرولەی

خستە بەر باران

ئەری بەر پرسیارم

!.. نوشتەمەوە بۆ بۆنی گوڵێ کەلەترسی پیاوانی نامەرد سەری خستبۆیە سەر ئەرزو چاوەرێ مەرگ بوو

منیان کردە بێ هەس ترین ئەو بێ هەستانە

منیان بەر پرسیار کرد لە ئافاتی ژیان بومە بکوژی

ئەقڵ ،

بۆنی تۆم لێ دێت بەو هەمو خوێنەوە

بۆنی ئەو پەپولەیە کە ئەم دەسو دەسم پێ دەکرد

لەخەیاڵی دیسان هێنەنەوەی باڵەکەنیدا بوم

... گیانی سپارد

ئەرێ گیانی سپارد

کوان هاوڕێکانم کوا براکەم کوان لەکوێن خێزانەکەم

!...ئەی تۆ لەکوێیت ،

!..بۆچی هێندە تەنهام ،

من لەهامان کۆ?ن گوێ رادێرم بۆ هەمان تاق تاقی

پێلاوەکەنت

جگە لە دەنگی تفەنگ شتێ نیە بۆ بیستن

لەکوێە پاساریە دڵ رەقەکەی کە تەنها بۆ تۆی

!دەخوێن ؟

ئەی (با)ی ناسازی دەمەو بەیانیانی پایز

ئاگادار بە ئێرە بەس مرۆڤی لێ نیە بروانە

ئەو دوو مێروە کە خەریکی پەیمان بەستنی ئەشقن

مەبە بەر بەست گەر تۆ بزانی چەن ئاشقن ئیدی

ڕویەکت نامێنێ پایزێکی تر لا هەمان جێگا گوزەر

. کەی ئەرێ

.. ئەرۆین

مەرگ مرۆڤ ئاسودە ئەکات

!!...ژیان مرۆڤ توڕە ئەکات

بەڵێ راستی ژیان لێرەوە دەست پێدەکات

مەرگت پێ ئاشنا دەکات

خۆی متمانەی بە خۆی نەماوەو بیری چۆتەوە ناوی

ژیـــــــانە

. ئەرێ ئەمە بوو ژیان

تینوم

تینوم بۆ ئەو قومە ئاوانەی لەسەر کانیەکە

بێ باکەنە دەستو قاچت تێ دەخست

سەر مەستانە دەمم تێ دەخست

من ماندوی دەستی زەمانوو فکرە شێواوەکانم

لە تۆ

من هەڵپەی ژیانمەو ژیان بەرەو مەرگم دەبات

بێ هودە باسی جوانی گوڵ دەکەم

کە پیاوان تەنها رەنگی سور لایان خوینەو

ژنانیش دەست بەدوعان بۆ پیاوانو لە خەمی

مانو نەمانیانا شتیکیان بیر نەماوە بەناوی گوڵ سەوزای

جگە لە کراسە خویناویەکانی مێردەکانیان

شتێکی دی نا بینن

ئەرێ ( بێ هودە خۆمان هیلاک دەکەین کە ئەمەلێکان نەماوە بەژیان ) ئەمە قسەی هەنێک بوو دەژیان بۆ

!.. مردن . نامردن بۆ ژیان

نا

ئەی بارانی سەر بەتۆفان وەرەو پاکمان کەرەوە

وەرەو ئەو مردوانە راماڵە وەرە ئەو رۆحە شەرێنگیزە

لە گیانمان بسێنە وەرەو شومانە ببارێ وەرەو

بیکە رۆژی خۆت

نا

ئەی بەهار جارێ مەیە ئەم مرڤانە خەریین بە تۆ

چاوەرێ کە زستانم راسپاردەوە تۆڵەی گوڵو پەپولە

بسێنی مرۆڤەکەن پاک بکاتەوە لەو رۆحە پیسە خاک پاک بکاتەوە لە خوین وە مرۆڤ فێر بکات بڵی

دوای من وەرزی خۆشەویستیە

. ئەرێ وەرزی ژیانەوە

ئەرێ

ئێستا ژیان ئاڵۆزە من هەمو ژیانم هەر چاوەروانی بوو

ئاخر

بەمناڵی بەیانیان کە لە خەو هەڵدەستام بە چاوەروانی خویندی کوکختیو بانگ کردنی

پشیلە لە لایەن دایکمەوە بە سەرم دەبرد کە جارو

!.. بار دەهاتن ئەرێ دەهاتن

ئێستاش

بەدیار ئازیزانمەوە سەری شەرەفم کز کردوەو

وەک مێرویەکی زیان بەخش لەگەڵ (با) دا دەرۆمو دێم ئەرێ پیری بەرۆکم بەر ناداو هەورێکی شوم

بەفری نا ئومیدێ دەبارێنێ بە سەرمدا

بەڵێ ژیانی من بێ ئازیزانم ئاوا دەبێ بەس بێ تۆ

... کۆتای دێ

شار فرە چۆڵە ئەرێ گەنجانی شارەکەم دەرۆن بێ باکەنە کە ئەوەنە بێ هەستن کە کەسێک هەیە بۆی دەژی بەڵێ کە ئەو بروا ئیدی .. شتێکی نامێنێ بە ناوی ژیان بەلێ بێ باکەنە دەژی

من نازانم لە کویوە دەست پێ بکەم

سەرتا زۆر قورسە بگرە کۆتایەکیش نازانم

تا پێچەوانە دەست پێ بکەم

نا ئەی پیاو زەوی شەرمەزار دەبێت کە دەنگت

بەسەر ژنێکدا بەرز دەکەیتەوە زەوی هەست بە

خەجاڵەتی دەکات کاتێ پیاو بونی خۆت لە سمێڵەکانتا دەبینیتەوە بەڵێ ئەی پیاو بروانە چ کارەساتێکت خولقاندوە بە شکاندنیی دڵی ژنەکان ..!

وەرە ئەی فاڵ گرەوەی شوم

دەستێ جلم بۆ کریوە ..!

وەرە بە درۆ شیرینەکانت بڵێ بەڵێ ئەو جلانەی لێ دێ کەدەی پۆشێ بڵێ ئێوە چارەنوستان هەر بۆ یەکە چەندی پارەت ئەوێ ئەت یەمێ تەنها بڵێ .!

من کارەساتم

سەیرکە لەم جەگەڵستانیە لەم بازاری بێ کەسیەدا

لەم مردنە بە کۆمەڵەیە لەم شوێنە بێ هەستەیە

بێ هودە شەری تەمەنمو شەری مانەوە دەکەم

بەڵێ

بومەتە کارەسات کە هیچیان دەرەقەتم نەیان

نازانم من رۆحێکم نەماوە بۆ دەر چون کە بەس

ئێخەی جەستمەمە دەی گرن ئیدی چلۆن بمرم .

وەختێ کە چوو رۆحی شیرینم دەرچوو ..!

کات ژمێرەکەم چ تاقەتێکی باشی هەیە

پێم دەڵێ ئێستا رۆژە ئێستا شەوە

پێم دەڵێ ئەوەنەی ئەوەنە کات ئەوەنە وە ئێستا چەند مانگە ئەو ونە بەڵێ سەیر چ تاقەتێکی باشی هەیە .

گوێم لە پیرە ژنێکی دەنگ لاواز بوو هاواری دەگەشتە عەرشی خودا بەو دەنگە کزەیەوە هاواری

دەکرد دەگریا

زانیم ئەمیش جزمەو کراسە خویناویەکەی کورەکەی

بۆ رۆشتبۆوە

ئەرێ ئەمە بوو ژیان

ویستم جیهانێی تازە دروست کەم ئیدی لە بەتی دەنگی تفەنگ گویمان لە سازوو سەنتورو گیتارەکانی ژیان بێت بەڵێ

دڵ گەرمانە سازەکەم دەر هێناو چەکەکەم فرێ دا

وەلێ بێجگە لەو سەگە ماندوو لاوازەی کۆ?ن کەسێک نەبو گوێ رادێرێ مرۆڤەکان چلۆن بێ هەست بون خودا

ئەرێ ئەمە ژیان بوو

تەنها سەگە شەلەکە نەبێ کەسێ نەبوو ئاوازەێکی تری بیر مابێ ئەویش زوو رۆی بەرگەی شەقی منداڵنی نەگرت کە وەک ئامرازێکی یاری بەکاریان دەهێنا بەرگەی

.نەگرتوو لە سەوچێکی بێ کەسیدا گیانی سپارد

ژیان ئەمە بوو نــــا

ئێمە ژیانمان شێوان بەدەستی خۆمان

ئێمە ئێستا پەشیمانین نا

دیسان هەر وا دەژین بەڵێ بە ئێمە دەڵێن مرۆڤ

کە هەموشتەکان گیری خواردوە بەدەستمانەوە ئەرێ

... ئێمە بیانوش دەگرین لە خودایەی کە ئێمەی خولقاندوە ئەرێ ئێمە خۆشمان نازانین بۆ دەجەنگین

من ئازادم لە نێو ئەو هەموو سجنە

پێمەکەنە پێم من خایاڵم ئازاد کردوە

ئێستا من لای تۆمو دیسان تۆ لای ئەو

من دەستم گرتویتو دیسان تۆش دەستی ئەو

بەڵێ سەیرکە

من دیسان هەر چاورێم ئەرێ ئەو رێبوارێکەو زوو

دەروات ئەزیزم ناهێڵم کە تەنها بیت زوو دەگەم

ها ها ها

سەیری ئەو خەیاڵە خویرەم خەریکە سنوری ئازادیش دەشکێنێ سەیر کە من ئازادم لەنێو

!... ئەو هەمو قەفەزە

ئەی یار ئەی تاریک ترین رۆشنای پێشوم

بروانە ئەهلی دڵ بۆ وا خەریکی عاشوران

ئەی ئازادی بەت بەخت لەم قەفەسە شکاوەدا

سەرێک لە ئەهلی مەستانی خۆتو شیوەن کەرانێک

بۆ خۆت نادەیتەوە بۆ ناپرسی ئەم عاشورایە تا کەی

وەرە ئەو سنیجرە بپسێنە وەرەو بیشکێنە ئەو قەفەسە

.. ئەرێ تەنها وەرە

بەگ زادەو ئاغاکانی نیشتیمانی فرۆش راو

رۆژێک دێ ئێمەش یەک دەگرین ئەرێ نیشتیمان

دەكرينەوە راتان دەماڵين تا لێواری مەرگ یەک یەک

ئەنجل ئەنجلی پارەكانتانو سەرواتو سامانەكانتان

دەبينن ئەرێ تۆلەی ئەو ئەو دايكە جگەر سوتاوەی هێندە گريا بۆ رۆڵەكەی چاوانەی كوێر بون

ئەرێ وا رۆژی ئێمەش هەڵ دێ

ئيدی لە نيشتيمانی ئێمەدا ماچ جێی گوڵ دەگرێوو

گوڵێش پارە

.... ئاهـــ ئەی خەيالی سەر لێشێواو سوپاس

ئەی شنە بای ئارامو فێنک

وەرە خۆت لە گيانی بخشێنە هەواڵی ئەومان بۆ بێنە

ببە بە گەردەلولو جێ پێ كانيمان بۆ بهێنە ئەرێ

بەس هەوڵ بە نازانێ من ناردومی هەوڵ بە

.. بێ ئاگا بێ بێ ئاگا لەمنی ماندوو

ئاهــــ

من ئێستا پێم دەڵێن بێ هەست بەڵێ ئێستا

بێ هەسترينم لای ئەو بێ هەستانە

بەسە

بەسە ئەی ئاوێنەی بێ رەحم كەمێكم خۆمم نيشان

بدە خەريبن پێم ئەم كەسانەی ناو ئاوێنەكە

توخودا بڵێ ئەمە تۆ نی يان بڵێ ناكرێ تۆبيت

خاک بەسەرم

دايكم چۆن دەم ناسێيتەوە ئاوا برۆم بۆ لای

.. نا ئيدی شتێک بڵێ نا ئەوە من نيم

ژيان ديسان خەريكی بەر بەرمكانێيەو

من شتێ نازانم

خەريكی پاشقول گرتنەو من هێشتا بە پێوەم

شەر لەگەڵ رۆحم دەكاو بێ ئاگا جگە لە جەستەيەكی بێ دايک هيچێ تر نيم ئەرێ

. ئەو خۆی ماندوو دەكات

ئەرێ

دڵم داوای پياسيەكی بێ تۆيم لێ دەكات دەک

!..پیاسەی مەرگت بێ ئەی دڵ بەتامای گۆرینی ئەویت

ئەرێ بونی تۆ بونی منە سەربازێک دیار بوو

هەرچی هەبوو لە دەستی دابوو توند ئێخەی

گرتم گوتی نەفام بۆ کێ دەجەنگی بۆ دەجەنگی

وتم بۆ ئەو دەجەنگم چاوانی پڕ بون گوتی

.... من ئەوم لەدەست دا

بەڵێ چیرۆکی ئەم پیاوە لێرەدا کۆتای هات ئەویش

.... رۆی ئیدی بۆ کێ بجەنگێ

بەڵێ سەیر کە

من شەری مانو مانو نەمان ئەکەم بەڵێ من دەمرم

بۆ ژیان

کەچی ژیانیشم بێ منەت کردوە ئەرێ ئەمە بوو

. سروشتی ئێمەی مرۆڤ

سەیرە

.. سەیرە گوێم لە دەنگی بارانە ئا کەمێک بۆستن ئەو تفەنگانە لا بەن دەنگی باران دێ ( تک تک تک ) چ ئارام بەخشە ئەو دەنگە

ئەرێهـــــــــ

من هێندە هەڵپەی ژیانمەو بۆی دەجەنگم

خۆ کاتێکم نەمەوە تێیدا بژیم

بەڵێ

وا گوێ رادێرم لەو دایکە جەرگ سوتاوە

خودا چۆن سنگی لێ دەکوتێ چلۆن کردویەتی

به عاشورا ئەرێهـــ

. ئەمە بوو ژیان

ئەی دەست بەری بە ئەو تفەنگە نەفرەتیە

تف لە تفەنگ کە نەفرەت لە جەنگ کە

ئەی دەست

ئازادی بە گردتنی چەک نابێ بە دەستت

.بەڵکو دەستێکی تر بگرە دەست لەو نەفرەتیە بەر بە

بەسی کە زەوی دەست لەو ئێخەیە بەر بە

سەیرکە هەوەڵی ئەو سوچێکی ئەو گۆشە گیریەی

چلۆن تەنیوە بەڵێ رێبوارێ فەرموی کەدێ

با بۆنی ئەوی بۆ هێنام باران بێ ئابروانە خۆی لە

گیانی دەخشانو جۆگەیەکی دروست کردوە تا

.. تا لای منی بێ هەست خۆی دەرژێنێ

پایزێکی چەند سام ناکە

دەنگی کەوتنی گە?کان وا گوێمان کەر دەکەن

مەگەر تۆ لە دوعاو شیوەنی دارەکەن ناترسی

ئەی پایز ؟! ئەم عاشورەیەیان پێ دەکەی

. چەندە چاو قایمی خاک بەسەرت

من نازانم نازانم ئایا تۆ یان مرۆڤ کامتان بکوژی سەرەکین

من نازانم نازانم ئایا تۆ یان مرۆڤ کامتان بکوژی

سەرەکین لەسەر زەوی کامتان ئەو مدالیە سەر بازیەی کە ئەو مرڤەی کۆتا جەنکاوەری جەنگەو بەکەم ئەندامیو زۆر ترین کوژتنەوە دەگەرێتەوە

لە کاتێکدا ئەو دڵەی بۆی لێدەدا کوشتیانوو

خێزانەکەیان دا لە دار ئەرێ وە سەرۆکەکەی

!... خە?تێکی باش کراو مدالیایەکی بێ کەڵکیش خە?تی ئەم ئەرێ ئێوە جەنگی ئەو مدالیە هیچە دەکان ئەی پایز ئەی مرۆڤ

ئاهــــــــــ

کەمێک بۆستن گوێ را دێرن بۆ ئەو کیژۆڵەیە

بە قورگی گریانەوە گۆرانی بۆ خۆشەویستەکەی دەڵێ کە برینەرەو بە بێ هۆشی بۆیان هێناوەتەوە

سەیرکەن ئە ئەمە بوو ژیان

لێرە وا باشە سەیری شت نەکەی

سەرت کز بکەو چاوت لە عەرز ببرە

منیش ئیدی دەرۆم

دەرۆم

دەزان چەند قورسە دور کەوتنەوە

دەزانی چەند سەختە بێ تۆی

دەزانی چەند بەئازارە بینینی ئەم هەو

نەخوێندەوارە

سەختە لەگەڵ تۆ بون وە مردنە بێ تۆ بون

من دەمەویێ خۆم هەڵ خەڵەتێنم دەستی منداڵیم بگرموو خۆم بەرم بۆ خیلیسکانێ ئەرێ دڵی منداڵیم

خۆش کەم ئەسەف جگە لە دایکم نەبێ منداڵیم دڵی

بەشتێکی تر خۆش نابێ خودا

چلۆن خۆم ژیر کەم چەنە پیس گیرم خواردوە بادەست خۆمەوە

من ورکنم ورکن دایم داوای ئەوە ئەکەم کە نیە

سەیرم کە قەیناکە براکەم پێم پێبکەنە

من گیرۆدەی دەستی رۆژگارم

خۆم داواتە دەست پایزی دڵ رەق

چەکم فرێداوەو گوڵێکم هەڵ گرتوە

ئەی کەم بە چاوی پایزاو بۆ رۆژگاری باس دەکەم

!... و نیشانی مرۆڤی ئەیەم

ئەی فریاد رەس

بگە فریای ئەو دڵەی کە لە باتی خوێن ناوی

تۆ ب?و دەکاتەوە لە گیانما

سەیر کە سەیر

.. لە پاش تۆ چ ئافتێکە لە ناو خۆمدا

شەرمەزار بی ئەی گوڵ.

ئەم هەمو بێ وەفایەت یانی چی پەپولە بۆ تۆ

وێڵ بوو وەختێ تۆ لای هەنگەکان بوی

سەیر کە خانم تۆ بەقسە بریقو باقەکانی پیاو هەڵمەخەڵەتێ رو لەو پیاوە وەر مەگێرە گیرفانی

وەک دڵی پاکە بێ هودە باسی سامانت بۆ دەکات

سەیری ئەو پیاوە مەکە کە پیاو بونی خۆی بە ئاسانی ئەدۆرێنی لە پێناوتا روش لەو پیاوە مەکە

حەزوو خەولیای جەنگەکانە . حەز لەو پیاوە مەکە

کە ئەیەوێ نا ئومێدت کات دڵت تەنکات تەنها لەبەر

.. ئەوەی زیاتر خەمیت بێتو خۆشت بوێ

ئەرێ

سەیری ئەو پیاوە بکە کە لەبەر تۆ بە کچانی شار دەڵێت خوشکەکەم وە هەمو کچانیشی خۆش بوێ لەبەر ئەوەی تۆ کچی بەڵێ ئافرەتی

ئەی مانگ

تۆ بۆ دیار نیت

ئاسمانی شارم هێندە تاریکو تەڵخە رۆشنایەکی

شەوان نابینین بڵێین بەڵێ مانگ وا هاتەوە وەرن

!... با بیشوبهێنین بە ئەو

سەیر کە سەیر

لە پاش تۆ مانگیش ونە دڵ گرانە دڵ گران لەم هەمو

مرۆڤە ئەویش بیری ئەو شەوانە دەکات کە دەبوو بە شەرمان لەسەر مانگ تۆ خیرەت لێ دەکردوو من

.. خۆشەویستم دەدایە

ئەرێهــــ

ئەی ئازادی کەنیت بێ هودە باست دەکەن بگەرێەوە

.. وەرەو ئازادمان کە

ئەی کزە بای پایز چاو لە بێ مەیلی یار مەکە هێندە

... ساردە با نەژاکێ ئەو گوڵە سیس بونی بێ هۆیە ئەو گوڵە ئەرێ دور کەوە لێی

ئەی خۆری دەمەو عەسرانی پایز

زوو ئاوا مەبە مەگەر بۆنی قژیت بۆ نایە ئاخۆ

لە چ نا ئومێدیەکا قژە ژاکاوەکەیت پیشان باتو تۆش بێ ئاگای لەو ئاخۆ کزە بای پایز خۆی لە گیانی نەخشێنێ ئاخۆ ئەبێت ئێستا ئەو باش بێت

سەری تەرەو یاویەتە دەست خۆری ئیهمالوو کزە بای سارد خۆی بۆ مە?س داوە

ئاخۆ دەبێ باش بێ ،..!؟

چەنە

جوان دەخوێنێ ئەو چۆلەکەیەی بۆ منوو تۆی دە خوێند ئێستاکە لەژێر فشارو هەرەشەیە

گۆرانی بۆ ئەو کچە شۆخە دەڵێت کە وا بەزۆر

.. دەدرێت بەشوو

ئەرێهــ بەو پیاوە بە تەمەنە

چیرۆکی کیژۆلەکە لێرەوە دەست پێ دەکات

کاتێ دەستی یایە پاچوو خاکەنازوو یەک یەک لە گۆرنانی ئەو هەزارەها خەونەی کە هیبوو

.. ئەرێهــــ لەبیر کردنی خۆیو بۆ خەڵک ژیان

سەیر کە ئازیزم

لە هەرکوێ ویژدان مرد

! لەو شوێنە دیکتاتۆرێ لەدایک دەبێ

لە هەرکوێ گوڵێک مرد

خوێنێک دەرژێ ئەرێهـــ

دڵێک دەمرێ لەو ناوادا خۆشەویستی لە

... دار دەدرێ

ئەی ناسک تر لە خونچەی سەر لێ شێواوی کاتی

نەهات شتێک لەناو ئەم جەستەیەدا پیس وەرەسی

کردوم و خراپ بانگت دەکات ئەرێ خراپ لێدەدا

سەیرە

چەندە بێ کەسە جادەکان  چەنە چۆلە شارەکەم

بۆ هێندە بێ نازە نیشتیمان ؟

بۆ هێندە بێ وە?مە پرسیارەکانم ؟ بۆ هێندە دەپرسم ؟

نا من باش نیم  ئەسڵەن باشێک نابیم  بکا گوزەر

لە پێش چاوم

چیم دی نەی بو سەری خۆی بۆ سەری کەسێکی دیش خەریکی ئێخە درین بوو

سەیری ئەم ئافاتە بکە چاوێک بخشێنە بەم

. بەم وێرانەیە دەستێ بێنە بەسەر بە ئەو هەتیوانەدا

بیستم پێان وتوی

ئەو دورەو مەشخولە لە کێشەی خۆیا چ را دەگات بەتۆ . ئەی پێان نەوتی ئەو کاتەی برسی بوو وەک تولەیەک راکە راکی بوو بەشێوێن دایکەکەیاو بۆ قومێ شیر وا دوای تێر بونشی دیسان راکە راک

.. گەران بەدوای تۆیا لەدوای نا ئومێدیش من مەشخولی ئەوەم ئەی ئەوەیان پێ نەوتی

سەیر کە سەیر

تانە بە تانە ئەڵێ برۆ ئەولاوە سەیر ئەوەیە

شێوەشی ناگرن مرۆڤەکان لەگەڵ ئەو هەمو تانەو

... تەشەرە

لە شارەکەی من

! باوک کچەکەی خۆی دەکوژێ لەسەر ماچێک

!!. بۆ پاک کردنەوەی ناموسی . نەفام بێ ناموسی رێگرتنە لە ماچوو دەر هێنانی چەکە چەک

ئاهـــــــ

بۆستە ئەی گەنج ئەو چەکە دانێ بروانە

پشتت ئەو کیژۆلەیە بە رۆشتنی تۆ رەنگە دڵی بشکێ رەنگە چاوەکانی بارانی زستانێکی سام ناک ببارێنێ بەڵێ رەنگە ئیدی دڵی تەنگ بێ .

گەر

گەر رەخنە گر بێتوو رەخنەی توندم لێ بگرێ ئاسایە سەری قەسیدەم کز دەکەمو دەی پێچمەوە

ئەرێ وەلێ تەنها رەخنەیەک لەتۆ بگرێ مەجبورم

رەخنە گر بکوژم تۆ لە باوەش کەمو پیاسەیەک بەناو

قەصیدەکەمدا بکەین ..

ئاهــــ چەنە بێ تۆم

گوێم لە دەنگی دوو منداڵی خۆش بەختن وا یاری

دەکەن یەکیان بە یەکیان دەڵێ چاو شارکێ ئەوی تریان دەڵێ راوراوکێ چەنە سادەن بێ ئاگان

رۆژگار خۆی بۆی بۆ ئەو یاریانە هەڵ گرتەوە

ئیدی کاتێ یاریمان ناوێ ئەسلەن ئێمە پێویستیمان بە واقعێکە ئەو ئەیکات بە گاڵتە

ئەوەی واقع پێی بەخشین ئەم بە گاڵتە بێ تامەکەنی لێمان دەستێنێتەوە ئەرێهـــ

دەمان کات بەگاڵتە جارو ورد ورد روخانی خۆمان دەبینین بە?م ژیان کارێکی وا دەکات کە تەنها خۆت ئەوە ببینیو لای ئەوان باش بی .. ئەرێ خۆزگەت پێ دەخوان

سەیر کە ئەم هەموو نامەیە کەوتوە

دڕاو پیس خوێناوی کوان ئەو کەسانەی بۆیان نوسرەوە کوان خوێنەری نامەکان

بەڵێ لەم نامەیە نوسراوە ئازادیم لەدەستی تۆیایە

لەیلا) نامەکە زۆر ئاڵۆزە بە خەتێکی ناخۆش نوسراوە بەس هێندەی لێ تێ دەگەم نوسراوە ئازیزم)

ئەم شەرە شەری نائومێدیوو تۆلەیە وەختێ ئەفسەرەکە بێ شەرەفانە وێنەکەی تۆی لێ سەندم )

دراندی ناوی تۆی لەگەڵ سۆزانیە کاندا هێنا.. ئەرێهـــ

من بەرە مەرگ دەچم لەیلا مەرگێ کەلەسەر تۆ بێ ژیانە لەیلا من تۆڵەی دراندوو زراندنی ناوتی لێ دەکەمەوە ئەرێ گەرانەوەم ئەستمە ....ماڵ ئاوا..)

وا خۆر ئاوا دەبێ زۆر بێ مەیلە

خۆر

تۆ بڵێی سبەی تاقەتی دیسان گەرانەوەی هەبێ

نازانم بۆ هێندە خەم گینن گشت شتەکان

به تەنها سەیر کردنێکیان دەزانین بێ ئەمەلی دەبارێ ئەرێ بێ مەیلی ...

منی دڵ پڕ چلۆن گۆرانی بۆ گوڵ بڵێمو

دەست بەسەر ئاشقێکی سەر لێ شێواو بێنمو

!.. باوەش کەمەوە بۆ تۆیەک کە لە باوەشی ئەواندا ئاسودا تر دەر ئەکەویتو پێت بڵێمەوە من ئاشقتم

ئەی مەرگ تکا دەکەم جارێ مەیە

ئەی ژیان تکا دەکەم هەڵ مەیە لێم

ئاهــ

شەوێکی چەند نامۆیە من لە نێو گومانو واقیعدا

گیرم خوردوە لە نێوم ئەو رسوا ژیانە رێ دەکەم

لەژێر دارێکی بێ گەڵا دەخەوم . پەنا بونی خۆم بۆ

مێروکەن دەگێرمەوە باسی دۆرانی ئەشقم بۆ شەو

... باسی رسوایم بۆ دارەکە دەکەم

سەیر کە سەیر شێتی سەری لێ داوم

دەستم لێ هەڵ ناگرێ پیری دەستی گرتوم و ئەمدات بە قومار چیانەی کە لە قاواخانە شڕۆلەیەکدا

دانیشتوەو گرەو لەسەر کچەکەی دەکاتوو پێی وایە پیاو بون لە بریارە سە قەتوو رسوایەکانیدایە

.. ئەرێ پیاو بون وا دابینی

ئاهــ

رۆژێک دێت بەیانیەو کەلەشێر دەقوقێنێ چ هەستێکە بانگی کچەکم دەکەم و بە سەرو قژێکی ئالۆسکاو ژێر چاوێکی رەشو شینەوە دێتو
بە دەنگە گرەکەیەوە بەیانی باشێکم لێ دەکات چ هەستێکە

بونی دوو باڵ بۆ فرین چ هەستێکە ناشتنی گووڵ لە باتی لەشەی ئینسانەکان چ هەستێکە چ هەستێک

... بۆ یەک ژیان

...وەرە ئەی کەمتر لە یەکەم دڵۆپە ئاوی ئادامی کە مەرگە ئێخەمان بەربە ئێمە دروست بوین بۆ ژیان نەک مەرگ

بەسیکە ئیدی من دۆرام

شەڕی ئەم برا کوژیەم پێ ناکرێ دەستەکانم شەکەت بون لە گرتنی ئەم ئێخانە وەرە هاورێم دەستێک بەرە ئێخەم وەرە پێم بڵێ ئیدی
سەرەی منە رێ لەو تۆسقاڵە نەفەسەم بگرە

چاوێک لە نا ئومێدیەکانم بروانە لە بێ هەستیم

.. هەستێک بە بونم بکە

ئەو کاتەی

خەیـــــــــــــــاڵ و خەونەکانت

لەو باوەشە سادەیەی دایکەوە دەگۆرێ بۆ باوەشی تر

ئەو کاتەی خەیاڵ لە گوندە بچوکەکەتان گەورە تر دەبێیو بەرەو شارێک هەڵ دێیت

ئەو کاتەیە کە

پێویستە دەست لە خۆ بونمان ..! بشۆینو ئیدی وەک

کەسێکی تر ژیان گوزەر کەین بروانە

چی بوو باوەشێکی تر جگە لەوەی دایکمان

!.. جگە لە خۆشیەکی چەن سەعاتی چ قور بەسەریەکو دڵ تەنگیەکی لە دوا بوو

چی رویدا کاتێ خەیاڵت ئازد کردوو جگە لە گوندە چۆڵەکە چاوی تەماحی لە شارە قەرە بالخەکە بری

چی رویدا کاتێ خەیاڵت ئازد کردوو جگە لە گوندە چۆڵەکە چاوی تەماحی لە شارە قەرە بالخەکە بری

.... چی رویدا کە خۆت دی لە نێوو ئەو هەموەدا تۆی تەنها گۆرانیەک دەخوێنی بۆ ئەو کە هەموان خەریین پێت چی رویدا تەماشاکە

نازانم

چاوەکانم بینایان کزە یان تاقەتی تەماشا کردنیان نەماوە

من وا دەبیینم کوکختی منداڵیو پشە تەمەڵەکە چ ترسانکن ئەم هەموو بەڵێنی هاتنوو نا هاتنەت

چ سام ناکە شەوی بێ مانگ

!.. چەنە جوانی تۆ بێ من

باوکە بم بەخشە

خۆ بەدەست دانم ترسنۆکی نیە باوکە

سەیرکە چلۆن پەنجەی نا ئومێدیوو پەنجەی دۆرانە

بە قاقا بێ مروەتەکانیانەوە بۆم را دەکێشن ئێستاش ئومێدێک هەیە بۆ هەستانەوەم نازانم

وەلێ باوکە منیش تامەزرۆی دیدارتنم کردوە

ئەوێک هەبوو کە توند چەکەکەم بۆ گرتبوو ئەرێ

لە هەموو شەرەکاندە بە ناوی ئەو بەرێ دەکەوتم بە خەیالی ئەو دەمامەوە دەمامەوە بۆ ئەوەی کاتێ

گەرامەوە دەستی بگرموو دور کەومەوە لەم هەموو

بێ شەرەفیەی بە ناوی شەرەفەوە دەکرێ دور کەومەوە لەم هەموو سو خۆرە لەم مرۆڤە بێ ئابروانە

وەلێ کاتی گەرانەوەمە بیستم

ئەوە هاورێی سو خۆرەکانەو بێ ئابروانە لەی ئەو

پیاوە بێ شەرەفانە دادەنیشتوو هەراجی کردبوو

جەستەی ئەرێهــ

ببورە ئەمە ئەو راستە بوو کە چاو پۆشیم لێ کرد

منیش وەختی رۆشتنم هاتوە

وەک ئەو دایکە وام کە سکەکەی ٩ مانگوو ٩ رۆژەکەی لێ تێک چوەو نازانێ کاتی هاتنی کەیە وەک رۆشتنی منە من بێ تۆ

دڵ گرانم دڵ گران

لەم گیرفان پرانەی شار لەم  بە تەکەبور ژیانە

لەم خۆ بە مالایکەت زانانە لەم بێ منەت کردنی شەیتانە

ئەی ئافاتی رۆح کە سارد بونی یارە لەگەڵ یار

ئەی کانیاو کە ئاوەو دەکات عبور بەچاوا لە کاتی رۆشتنی یارا

سەرێک لە خۆتان بدەنەوە برونە نەکا خۆتان نەناسنەوە بەسیکە بگەرینەوە لای خۆتان وەرە ئەی دڵ کە نیە حزورت لەلام لەکوێی بگەرێوە ئام سینەیە

ئەی جادوو گەر

... ئەی قور بەسەری رۆژی نەهات وەرەو جادوی لێ بکە بە جنەکانت بلێ بیدوێنن نەکا تەنها بێ بیانکە چاو دێری با بێ هیوا نابێ

تەماشایئەم ئینسانانە بکە

کەس وێنەی خۆی لەبەر چاوو نیە کەسێک نیە ئەو

وێنانەی ناو ئاوێنەکان بناسێ بەڵێ وێنەکان خۆمانمان نیشان نادەن کەسێکی خەریبەن یاخود

... خۆمانین ناماوە لە فکرمان کە کێین

دەترسام

دەترسام کاتێ بیرم لە ژیان دەکردەوە

... ژیان ترسانومی درەندە ژیانە

وا هەوری ئومێد دەبینم

وادیارە

بارانی شادی پێیە

بارانی شادی پێیە هەواڵی رەنگە پڕ بێت لە هەواڵی

ئازیزان لێوان لێو بێت لە خۆشی ئەو مەرگە درۆیەنە راست کاتەوە زۆرێک لەم مرۆڤانە بەدرۆ خاتەوە

راست بونی یارمان نیشان بات دەست باتە بینی

ئەو بوختیان چیانەی درۆیان بۆ هەڵ دەبەست

ئێخەی ئەو قاچاخچیانە بدرێ کە پێکەنینیان

.. دەبرد بۆ سنورەکانی شادی و لە ویرانەکان باروتیان بۆ دەکرین

بارانی شادی هەر ئەو بارانەیە کە پار بوە تۆفانوو

ناوی دڵ رەق ترینی پێ بەخشرە

ئێستاکە

تۆبەی کردوەو نازناوی شادی بەدەست هێناوە

سەیرکە خەڵکی چەنا نائومێد بوو ڵێی ئێستاکە

.... هیوای ئەوە

ئاهــــ

ئەم باڵ دارانە بۆ نافرن دەبێ چی لە مرۆڤ چاوەڕێ بکەن جگە لە خواردنو کوشتنیان بە ناهەق

چەن دڵ سافە مراوی

کەلەشێری دڵ تەڕ کە ئێستاکەش گۆرانی بۆ مریشکێک دەچڕێ کە گومانی مانوو نەمانی مریشک لە مێشکی کەڵە شێردا کاتی خوێندنی !لێ تێک داوە ئەرێ مامە پیرە پێی دەڵێ شێت ،؟

سەیرکە

من تاریک ترم لەو شەوانەی کە تۆ ئەستێرە بزێوەکەی خۆتت نیشان دەدامو منیش مانگم پێ دەشوبهاندی لە قاوەی ئەو قاوە گرەوەیە بێ چارەیە

رەش ترم کە بۆ بەخت رەشەکانی دەگرتەوە

ئەرێهــ

...من رسوا تر دەبم کە دەبینم کورەکە لە پێناو ئافرەت سفەتی پیاوەتی خۆی دۆراندوە بەڵێ لەدەستی داوە

... من قەرزاری ئەو گۆر هەڵکەنەم کە بە رۆژ دڵی خانەوادەی مردومەکە دەداتەو شەویش دڵی مردومەکە رادەگرێ

بیزارم

بێزارم لەو پیاوانەی کە دەچیتە پاڵیان جگە لە بۆنی تەپلەك هیچی دی لێ نایە

ئەرێهـ بێزارم

.... لەو ژنە خیانەت کارانەی بۆ پارە هەراجیان کردوە دڵیان دەیشکێنن دڵ

ئیدی منیش کاتی رۆشتنمەو ژیان پێم دەڵێ قەصیدەکە بۆ ئەو دوو حاجی لەق لەقە بەجێ بێڵەو ئەوان باسی ژیانو باسی مەرگی پەپولەو ئافاتی ژیان بە خەتێکی باشتر دەنوسنەوە بەڵێ ئەوان بێچوەکانیان فێرە خوێندنەوەو فێری ژیان دەکەن

دەستی مەرگ دەگرنوو ژیانی پێ نیشان دەدان

بەڵێ

من کاتی رۆشتنمەو ئیدی مەلەکان کاتی هاتنیانە

ئیدی ژیان لەو خاڵەی کە گوڵەکە بوە ژێر پێی سەربازەکەو جەنگ هەڵ گرسا گوڵێکی دی چانراو گۆرانیەکی خام ناک بۆ گوڵە مردومەکە وترا

مەلەکان باسیێمەیان هەڵ گرتوە بۆ پەند بۆ نەوەکانیان لە شەوانی درێژی زستانا وەک چیرۆک بۆ

بێچوەکانیان دەخوێنەوە

ئیدی ژیان دەگەرێتەوە منیش لەگەڵ مەرگا دەرۆم

لە شەوێکی ساردا دەگەرێمەوە من بێ هەست نابومم وەلێ ئەمە نازناوم بوو ببورە ژیان ببورە من هەڵە جەنگام ئیدی پەنا بونم دەبەخشمە

مەلەكان ئەوان ژيان دێنەوە بەهار قەولی هاتنی دا

.... منیش ماڵ ئاوا

---

كۆتای

---

ببورن بۆ هەر هەڵەو کەمو کورتیەک

------------------------------------------------------------

لە نوسینی :- ئیدە پاتۆ